

# من لە تۆ هۆشیارترم چونکە...



نووسینی: مەهدی طباطبائی
وەرگێڕانی : تابان باقی

ناوی کتێب : من لەتۆ هۆشیارترم، چونکە...

نووسینی : مەهدی طباطبائي.

وەرگێڕانی : تابان باقی

پێداچوونەوەی : جمال محمد

نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە

نۆرەو ساڵی چاپ، چاپی یەکەم ٢٠١١

## من لە تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

هەمیشە بیر لە ژیان و زیندوو بوون دەکەمەوە...

لەو باوەڕەدام کەسێك لە ژیاندا دەمێنێتەوە کە نەرمی نواندنی زۆرتری هەبێت...

بەڵێ، هەمیشە بیر لە نەرمی و ڕێگاچارەی نوێ دەکەمەوە...

تەنانەت کاتێکش پشتت لێکردم و، تامی ئازار و هیوای ئارەزووبازی و ئارامی و مەرگت پێ چەشتم... مردن و (ئاسوودەکردن) چەندە بە چێژ دەبوو...

بەڵام من دیسان نەرمیم نیشان دا، بەرپرسیارێتی و ژیانم هەڵبژارد.

وادەزانی تەنیا جێت دەهێڵم تا لەم دونیایەدا بێناو بی و لەبیر بچی؟

وا دەزانی ئەوینی ئێمە و مرۆڤایەتی بە کۆتا گەیشتووە؟

من تا هەردوکمان نەگەیەنمە نەمریی، ناحەسێمەوە...

تۆ لەگەڵ هۆشیارترین کەسی دنیا ڕووبەڕووی، کە بیر لە بەرژەوەندی هەمووان دەکاتەوە...

تەنانەت مرۆڤە خراپەکانیش!

هێی پەلە مەکە!

لەسەرەخۆ بە شوێنما وەرە

باوەڕ بکە من بیر لە بەختەوەری هەردووکمان دەکەمەوە.

تەنیا ئەوەندە بەسە بەر لە هەر کارێك فێرت بکەم چۆن لە مێشکت سوود وەربگری...

ئەوەندە بەسە فێرت بکەم...

بەر لە سود وەرگرتن لە مێشکت بۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەوانی تر...

ئاوەدانکردنەوەی خۆتت، فێر دەکەم... تا لەگەڵ رەنج و نارەحەتیەکاندا رابێی...

فێر ببی... بۆ پێویستییەکانت، خۆت بەکار ببەی، نەك ئەوانیتر...

فێـرت دەكـەم چـۆن لاربوونـەوەكانی كەسـەر و مەینـەتی دەموچـاوی مرۆڤـەكان بخوێنیتەوە و لە خەم و مەینەتییان ئازار بكێشی... فێرت دەكەم چۆن لـە خوێندنـەوەی لاربوونەوەی هێڵەكانی عەشق و شادی مرۆڤـەكان پـڕ ببـی لـە ئـەوین و، بـۆ بینینـی ئـەم لاربوونەوە جوانانە، هـەموو بـوون و ژیانـت ببەخشـی... بـۆ ئـەم كـارە... دەبێـت فێـرت بكەم...

چۆن بە بیركردنەوە و كاركردن بە خۆت ڕا بێی...

باوەڕ بكە عاشق بوون و گرنگیدان بە مرۆڤەكان كارێكی ئاسانە،

تەنیا دەبێت بەرلە هەركارێك باش فێر بكرێی...

كە لەوانیتر هۆشیارتر بی... نەك بەهێز و دەسەڵاتدارتر...

# من لە تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

دووبارە دروستکرن...

مرۆڤەکان زۆرجار بەردەوامیی و هەوڵی مێروولەکانیان ستایش کردووە و، پەند و وانەیان لێوەرگرتووە

هەرچەندە خودی مێروولەکان هەرگیز مەبەستی پەند و وانەیان نەبووە

مرۆڤەکان وەفاداری سەگەکان ستایش دەکەن و بە هێمای هاوڕێیەتی، عەشق و وەفای دەزانن.

هەرچەندە سەگەکان هەرگیز مەبەستی شانازی کردن و فێرکردنیان نەبووە...

مرۆڤەکان ستایشی رەسەنایەتی ئەسپەکان دەکەن و لە جەستە جوانەکەیان چەندین

شانۆیان دروستکردووە بۆ ئەوەی ئەسپەکان چاوەڕوانییەکیان هەبووبێت.

مرۆڤەکان ستایشی نوور و رووناکی خۆریان کردووە و پێیدا هەڵدەدەن

بێئەوەی خۆر بتوانێ لەم ستایش کردنە تێبگات.

تەنانەت مرۆڤەکان شیعریان بەسەر تارکیی شەو و جوانی مانگدا چڕیوە و باسیشیان کردوون...

کەچی تاریکی و شەو دەبنە هۆی ئەوەی بڕۆنەوە ماڵەکانیان و تەنیابن

پێتوایە مرۆڤەکان لەگەڵ ئەم هەموو خۆشەویستی و هاوڕێیەتییە، سپڵە و پێ نەزانن؟

وادەزانی مرۆڤەکان بەهای هیچ شتێك نازانن؟

پێتوایە ئەگەر بە میهرەبانییەوە لەگەڵ مرۆڤەکان چاکە بکەیت، بەخشینی تۆ فەرامۆش دەکەن؟

باوەڕ ناکەم...

هەر لەبەر ئەمەشە مرۆڤەکانم خۆشدەوێ...

و بۆ تێگەیشتن لێیان، کات تەرخان دەکەم و بەهایان بۆ دادەنێم.

هەر لەبەرئەوەیە کە دڵنیام گەر بیر لە بەختەوەری ئەوان بکەمەوە ... ئەوانیش بیر لە بەختەوەری من دەکەنەوە

لەبەرئـــەوەی کـــە ئـــەوان چـــەندینجار ســـەلماندوویانە بـــۆم، هـــەر ســـەرنجدان و خۆشەویستییەك کە لەگەڵیاندا دابەشی بکەی، چەندقات بۆت قەرەبوو دەکەنەوە...

تەنانەت ئەگەر خۆشت نەتەوێ...

و ئامادەگیشت نەبێ...

هەر لەبەر ئەوەیە مرۆڤەکانم خۆشـدەوێ... و لـە سـەرجەم ساتەکانی ژیـانم بـیر لـەم وونەوەرە سەیر و نازدارانە دەکەمەوە...

وە شانازی دەکەم کە لە نێوانیاندا دەژیم...

## من له تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

تکایه مرۆڤەکانتان خۆش بوێن و کاتیان بۆ دابنێن.
تکایه لەگەڵیاندا هێمن بن و بۆ یارمەتیدانیان کات و پاره خەرج بکەن...
ورد بەوه هەر ساتێك که مرۆڤێك بیر له مرۆڤەکانی دەکاتەوه و کاتیان بۆ دادەنێ...
جیاوکێك به جیاوکەکانی مرۆڤایەتی زیاد دەبێت...
و رووداوێکی باش له دەوروبەرمان روودەدات..
تەنیا لەبیرتان نەچێت، گەر ئەتانەوێت باش بن و یارمەتی کۆمەڵه مرۆڤێك بدەن...
ئەم سیفەته بەرجەسته بکه و له خۆتدا به بەردەوام دەری بخه و، به هەمووان بڵێ که
چ بڕیارێکت هەیه...

هەرگیز له باشبوون، ماندوو نەبن...
تا مرۆڤەکان بەم سیفەتە بەرجەستانەوە بتناسن...
باوەڕکەن ئەوان هەواڵەکانی ئێوە فەرامۆش ناکەن و هەمیشە لەبیرتانن.
تەنانەت ئەگەر خۆتان بێ ئاگابن و لە ژێر خاك و خۆڵیشدا خەوتبی...
وەك سەعدی، حافز، شاملۆ، ئەدیسۆن و هەموو پیاوچاکانی تر...
کە ئەمڕۆ نین... بەڵام هێشتا مرۆڤەکان سینگیان بە بەردەکانیان دەکوتن و نووسین و یادەوەرییەکانیان نیشانی یەکتر دەدەن... تا هەرگیز لەبیر نەکرێن.

# من له تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

کاتێک دەتەوێ ببیته پیانۆژەنێک،
دەچیته خولی پیانۆ و دەبێت پارەیەکی زۆر بدەی، چونکه فێربوونی مۆسیقا گرانه...
کەچی تۆ پارەکەی دەدەی... هەموو ڕۆژێك، به چەندین کاتژمێر ڕاهێنان دەکەی..
چونکه دەتەوێ ببیته پیانۆ ژەن...
بڕیارت داوه ئاهەنگی سەرەنجڕاکێش درووست بکەی و هەستی هەمووان بورووژێنی...
هەندێ کات زۆر ماندووت دەکات و دەزانی کارێکی زۆر قورسه
بەڵام تۆ بەردەوام دەبی لەسەر ئەم کاره و هەموو ڕۆژێك ڕاهێنان دەکەی...

بە کاتژمێر ڕاهێنانەکەت زیاد دەکەی، لەبەرئەوەی بە ڕاهێنان کردن خووت گرتووە و تەنانەت لە چێژ لە ڕاهێنان کردن وەردەگری...

هەر بەو شێوەیە درێژە بە کارەکەت دەدەی...

ساڵی یەکەم، تاڕادەیەك ماندووکەرە و تۆ باشترین نابی، بەڵام دیسان درێژەی پێدەدەی...

ساڵی دووەم تێدەگەی ملیۆنان کەس وەکو تۆن، کە هەموو ڕۆژێك دەژەنن و ڕاهێنان دەکەن

و تۆ لەگەڵ ئەوەی لەم بابەتە دەزانی دیسان هەوڵ دەدەی

و هەموو ڕۆژێك زیاتر ڕاهێنان دەکەی... ساڵەکانی سێیەم و چوارەمت بەخێرایی پێشدەکەوی

و دەست دەکەی بە درووستکردنی ئاوازی سەرەنجڕاکیش...

بەڵام هێشتا سەدان هەزار هەن کە باشتر لە تۆ دەژەنن، بەڵام تۆ دیسان درێژەی دەدەیتێ...

بیری لێبکەرەوە بە بوونی مرۆڤگەلێکی زەحمەتکێشی وەکو تۆ هونەری مۆسیقا رۆژ لە دوای رۆژ باشتر و باشتر دەبێت...

بە بوونی مرۆڤگەلێکی وەکو تۆ خەڵکی هەر پیشەیەکیان هەبێ بەشێك لەکاتی خۆیان بۆ بیستنی مۆسیقاکەی تۆ تەرخان دەکەن و لە مۆسیقاکەی تۆ و هاوکارەکانت چێژ وەردەگرن...

لەبەرئەوەی مرۆڤەکان وەك تۆ رۆژانە کاتی خۆیان بۆ باشتر بوون تەرخان دەکەن...

و سەیر نییە... ئەم هونەرە ئەوەندە بەرەوپێشەوە بڕوات... و ئەوەندە جوان و سەرنجڕاکێش بێت...

کەس خەڵکی ناچار ناکات گوێ لە ئاوازە سەرەنجڕاکێشەکانت بگرن، ئەوان بۆ کڕینی

کاسێتەکانت پارە دادەنێن، چونکە جوانن...

ئاواتێکم هەیە...

خۆزگە مرۆڤە باشەکانیش وەکو تۆ، بە هونەری باشبوون هۆگر دەبوون

و وەکو هونەرێك سەیری (باشە)یان دەکرد...

وە بە بێمنەت و بێ رووپامایی ڕۆژانە ڕاهێنانیان لەسەر باشبوون دەکرد...

و لە باشەی خۆیان چێژیان وەردەگرت...

و لەجیاتی هەڵبژاردنی ململانێ، باشبوونیان بەهێزتر دەکرد و هەموو رۆژێك ڕاهێنانی زیاتریان لەسەر باشبوون دەکرد.،، و ئەوەندە بە جوانی باشبوونیان نیشان بدایە کە...

هەمووکەس ئارەزووی بکردایە باش بێت...

وەکو تۆ کە هەموو رۆژێك راهێنان لەسەر باشبوون دەکەی...

خۆزگە هەمووان، هەموو رۆژێك راهێنانمان لەسەر خۆشویستنی مرۆڤەکان دەکرد...

# من له تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

کەمێك مرۆییانە ڕاهێنان بکەین...

ئەگەر کەسێك خراپەی بەرامبەر کردین، داوای لێبوردنی لیّ بکەین و بڵێین بەداخەوە کە ڕێگەچارەی باشتری

بۆ باشتربوون نەدۆزیوەتەوە...

دڵنیام (مرۆڤ) داوای لێبوردنت لێدەکات.

ئەگەر کەسێك بەگاڵتەوە پێمان پێکەنی، ئێمەش پێبکەنین و نیشانەی سەرکەوتنی بۆ بنێرین...

دڵنیام شەرم دایدەگریّ و لەناخی دڵەوە پەشیمان دەبێت...

ئەگەر کەسێك بە تووڕەییەوە سەیری کردین، چاوی لێداگرین و پێبکەنین...

دڵنیام دڵی ئارام دەگرێ و له تووڕەبوونەکەی کەم دەبێتەوە.

ئەگەر کەسێك سوکایەتی پێکردین، زەردەخەنەیەك بکەین و سەیری بکەین...

تەنیا زەردەخەنە... بەدڵنیاییەوە لەو ڕەفتارەی داوای لێبوردن دەکات و هەرگیز سوکایەتیمان پێ ناکات

ئەگەر کەسێك سامانەکەمانی دزی... یارمەتی بدەین تاوەکو له هەڵەکەی تێبگات، تەنانەت ئەگەر پێویستە هەندێك پارە کۆ بکەینەوە و پێی بدەین و پێی بڵێین... دیارە تۆ پێویستت بووە کە ناچار بووی پارەکەی ئێمە ببەی...

دەگری و له ئامێزمان دەگرێت...

گەر کەسێك ئازاری داین یان بەتەما بوو ئازارمان بدات...

به میهربانی و هاوڕێیەتییەوە یارمەتی بدەین

تا له ڕێگاکانی ترەوە هەست بەچێژ و خۆشی بکات و

ئازاردانی خەڵکی فەرامۆش بکات...

پێتوایە مرۆڤەکان لەدوای بینینی ئەم ڕەفتارانەمان هەست بەچی دەکەن؟

بڕوا بکەن مرۆڤەکان، میهرەبانتر و خۆشەویست تر دەبن و

هەرگیز فەرامۆشمان ناکەن...

هەڵبەتە لەبیرمان نەچێت هەندێ کات، هەندێ لە ڕەفتارەکانمان وەڵامی دروست نادەنەوە... و هەمیشە لەسەداسەد نییە...

لەبەرئەوەی مرۆڤەکان وەکو یەک نین و لە ڕەفتارەکان، ئەنجامی جیاواز هەڵدەسەنگێنن.

ئێمە کاتێك وەها بڕیارێك دەدەین...

وەکو زانایەك واین کە مەبەستمان ناسینی مرۆڤەکانە و

بۆ گەیشتن بە مەبەستمان تەواوی ژیانمان لە پێناو ئامانجەکەمان دەبەخشین...

## من لە تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

مرۆڤەکان بەدەستەکانیان کار دەکەن...

کاتێك تەوقەیان لەگەڵ دەکەم دەتوانم گومان بە پیشەکەیان ببەم...

زبر یاخود نەرم؟ هونەرمەندن یان فرۆشیار؟

بەهێز یان لاواز؟ کارمەندن یان کرێکار؟

بەنیگاکانیان زانیاری دەست دەخەن و دەکرێ

لەروی نیگاکانیانەوە مەزەندەی سامان و ئەزموونیان بکەم...

حەسرەت یان بێ مەیلی؟

راستگۆیی یان نواندن؟

لەروی جلەکانیانەوە بارودۆخیان..

پیشەیان، لەسەر کار دەگەڕێنەوە یان بۆ سەر کار دەڕۆن!

بەڵێ... من مرۆڤەکانم خۆشدەوێ...

لەبەرئەوەی هەمیشە راستگۆن و تەنانەت درۆزنترینیان بە باشترین شێوە ڕاستی ئاشکرا دەکات...

بۆ تێگەشتن لە مرۆڤەکان ئەوەندە بەسە کە عاشقیان بی... و بە وردی و وریایی سەیریان بکەی...

## من له تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

مرۆڤەکان زوو لەگەڵ (مرۆڤ) دەبنە دۆست..

ئەگەر سەیریان بکەی، سەرنجت دەدەن و سەیرت دەکەن...

ئەگەر بەرەو روویان پێ بکەنی... لەوانەیە بەرەوروت پێ نەکەنن

بەڵام هەرگیز نیگەرانت ناکەن

تەنانەت هەندێکات لە خۆشیدا دڵیان توند لێدەدا...

ئەگەر یارمەتیان بدەی، خێرا سوپاست دەکەن

بەڵێ مرۆڤەکان بەو شێوەیەی کە دێتە پێش چاو، ترسناك و بێ هەست نین...

و ژیان کردن لەلایاندا زۆر بەتامە...

ئەوەندە بەسە لێیان گەڕێی بە حاڵی خۆیان و نەبیتە بەربەست لەبەردەم ژیانیان..
هەندێجار لەبەرخاتری چاکەکانیان سوپاسیان بکەی...
ئەوان سوپاست دەکەن و تەنانەت بەشێك لە بەختەوەرییان لەگەڵتدا دابەشدەکەن
تەنیا ئەوەندە بەسە ئەوانت خۆش بوێ...
بۆ ئەم کارەشت پێشنیاز دەکەم...
بەسەرهاتی ژیانیان بخوێنەرەوە و لە تواناکانیان ئاگاداربە...
بەڵێنیت پێدەدەم لە ماوەیەکی کورتدا هۆگریان دەبی و چارەنوس و ژیانت بە چارەنوس و ژیانی ئەوانەوە گرێ دەدرێ.
بەختەوەری ئەوان دەبێتە بەختەوەری تۆ.

## من لە تۆ وشیار ترم، لەبەرئەوەی ...

لەبەرئەوەی بڕوام وایە دەبێت هۆشیار بیت، تا لەم دونیایەدا بە ئامانجەکانت بگەی.

بەهێزبوون بەس نییە... نە، ئەسڵەن بەس نییە.

تەنانەت بڕوام وایە دەبێت هێز بخەیتە لاوە، چونکە گەوجێتی و بە هەڵەداچوون دروست دەکات.

من لە تۆ هۆشیارترم، چونکە لە نێوان هێز، پارە رەنگاوڕەنگەکان و مرۆڤەکان، دەتوانم مرۆڤەکان هەڵبژێرم.

باوەڕ بکە دەتوانم و براوەی کۆتاییش منم...

ئەگەر باوەڕناکەی دەکرێت مرۆڤەکانت لە پارە ڕەنگاوڕەنگەکان خۆشتر بوێت.

پێشنیاز دەکەم مۆڵەت بدە کەسێك کە برژانگی درێژ و جوانی هەیە لە چاوەکانت ڕامێنێت... گرنگ نییە ڕانەمێنێت... مۆڵەت بدە سەیرت بکات

تۆش لێی ڕامێنە ... ڕووبەڕوو...

ئارەزوو دەکەم برژانگی چاوە جوانەکانی مرۆڤەکان ببینی.

مۆڵەت بدە زەردەخەنەیەکت بەڕوودا بکات... ئەگەر هەناسەت دێتە سەرەوە...

پێم بڵێ چ شتێ لە ژیاندا دەتوانێ ئەم روخسارەی تۆ زیاتر بوروژێنێ؟

باش لە پێکهاتەی روخساری ورد ببەوە...

ئێستا مۆڵەت بدە لە باوەشت بگرێ...

مۆڵەت بدە دەموچاوە زبر یان نەرمەکەی لەسەر گۆناکانت هەست پێ بکەیت...

بەڵێنت دەدەمێ ئەگەر ئەو ساتە دەست کورتترین مرۆڤی دونیاش بی...

پێت خۆشە تەنیا گوێت لە یەك رستە بێت... بەڵێ، خۆشم دەوێی...

باوەڕ بکە لە ناخی مرۆڤەکاندا شتگەلێك هەن کە ناکرێ بە پارە بیانکڕی...

باوەڕ بکە ئێمە وێکچوونێکی زۆر گرنگمان پێکەوە هەیە...

ئەگەر لەبیرت نەچووبێتەوە...

ئێمە هەموومان مرۆڤین...

باوەڕ بکە من ناتوانم ئەوانە بە پارە بگۆڕمەوە...

لەبیرت بێ هەرشتێك کە لەم دونیایەدا دەبێت بیکڕی، دەبێ لە مرۆڤەکانی بکڕی...

نەك لە پەریەکان لە خەیاڵ!

## من لە تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

بۆ بیرو باوەڕم بەها دادەنێم...

ئەوانە بۆ مرۆڤەکانیتر بە ساناترین زمان کە بکرێ دەنوسمەوە.

دەمەوێ مێشکت بتەقێنم، دەمەوێ فێری ریسك کردن ببی و ئەم ریسکە دەکەم تاکو بکەومە بەر رەخنەی مرۆڤەکانەوە...

دەمەوێ فێرت بکەم وەکو من بی...

دەمەوێ هەنگاوی یەکەم هەڵگری و قسە بکەی

چونکە لەو بڕوایەدام رێگای گەڕانەوە نییە...

ئێمە لەدایکبووین و کار لە کار ترازاوە...

ئێمە هاتینە ئەم دونیایەوە و لە قۆناغی لەدایکبوون تێپەرین...

کەواتە بەرەو پێشەوە بجولێین... و ژیان بکەین...

کەواتە بە یارمەتیت هەرشتێك کە بە مێشکتدا دێت، بیڵێ...

تەنانەت بیرە ناشیرینەکانیشت... و لە نیگەران بوونی من مەترسە و باوەڕ بکە ئێمە دەبێت بەرەو پێشەوە بڕۆین و بواری ڕاوەستان نییە...

دەبێت باشتر و باشتر بین، ڕێگایەك جگە لە لەدایکبوون و باش بوون نییە، لەبەرئەوەی ژیان لە حاڵی لەدایکبوون و گوزەردایە...

براوە کەسێکە کە دەڕوا و ڕاناوەستێ

مرۆڤە هۆشیارەکان دەڕۆن و تێدەپەڕێن...

## من له تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

لەبەرئەوەی دەزانم دروستکردنی لۆرییەك، باشترە لە بەستنی سەدان گوێدرێژ بە گارییەکەوە...

و بە دڵنیاییشەوە لۆرییەك زیاتر لە سەدان گوێدرێژ بار دەبات

دەزانم دەستخستنی ئالیك بۆ سەدان گوێدرێژ زۆر سەختتر و گرانترە لە دەستخستنی کەمێك (گازوائیل) بۆ لۆرییەك.

دەزانم پێنان بە پەیدانی گازی لۆرییەك ... زۆر ئاسانترە لە ئازاردانی سەدان گوێدرێژ بۆ بارێك.

دەزانم ئەگەر ساڵێك تەنیا لە باش دەوڵەمەندبوون بیر بکەمەوە

زیاتر له چەندین ساڵ خراپ قۆستنەوە لەوانیتر سامانم دەبێت
لەبەر ئەوەی له زیرەکیم بۆ بەرژەوەندی هەموو سوودێك وەردەگرم...
بەم شێوەیە داوا له هەمووان دەکەم سوود له زیرەکییان به ئاراستەی بەرژەوەندی یەکتر وەربگرن.

## من لە تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

مرۆڤەکان دوو ڕەگەزیان هەیە، پیاو و ژن...

پیاوان و ژنان کاتێك کۆرپەلەن هەردووکیان هەم ناشیرینن هەم بچووك...

زۆر زەحمەتە بزانی ئەو کۆرپەلەیە کچە یان کوڕ!

تا کەمێك گەورەتر دەبن...

کاتێك کەمێك گەورەتر دەبن...

لەوانەیە سێ مانگییان، زۆر خوێن شیرین دەبن

بەوتەی هاوڕێکەم ... دەبنە خواردەمەنی... بەخ بەخ... بەخ بەخ

ئەوکاتە هێشتا هەردووکیان وەکو یەکن و دیسان کەمێك سەختە...

کە بزانی کامیان ژنە و کامیان پیاو... تەنیا دەتوانی ماچیان بکەی و لەگەڵیان یاری بکەی...

زۆر خوێن شیرین و میهرەبانن... چونکە تەنیا مامۆستایان دایکە...

ئەوانە وەك کرم لەسەر زەوی دەخلیسکێن و بە بچوکترین لاساییکردنەوە پێدەکەنن...

هەڵبەتە سەرئێشەشیان هەیە کە دایك خۆی ڕادەگرێ... و ئێوە هەرگیز ئەو سەرئێشانە هەست پێ ناکەی

وەلێ دیسان ڕەگەزی مناڵان جیاوازی ناکات و دیسان ناکرێ بزانی کامیان ژنە و کامیان پیاو...

دەبێت دیسان چاوەڕێ بی کە گەورەتر بن... لەوانەیە ببنە شەش مانگی...

بەڵێ ئەوکات دەتوانن چواردەست و پێ بڕۆن بە ڕێگادا... بەردەوام بەدوای دایکیان لەم ژور بۆ ئەو ژور دەڕۆن...

گۆناکانیان شۆڕە و هەندێ کات نقەنق دەکەن لەبەر ئەوەی خەریکە ددانیان دەردێت..
کاتێك پێدەکەنن وەکو کەروێشکیان لێدێت...
وەلێ دوایی زۆر خوێنیان شیرینە و بۆ خواردن دەشێن... و دەکرێ بە تەواوی گەمەیان لەگەڵ بکەی...
هەڵبەتە ئازاریان هەیە و شەیتانیش دەکەن، کە دیسان روو لە دایکەکان دەکاتەوە...
وەلێ دیسان نازانرێ ئەوانە پیاون یان ژن... و دەبێت چاوەڕێ بین تا گەورەتر بن...
تا ئەو کاتەی قژیان درێژ دەبێت و دەبنە دوانزە مانگ
تازە رێگا رۆشتن، فێر بوون...
بەڵام دیسان جلەکانیان... یاریەکانیان... پێکەنینەکانیان، سەروسیما و لاساییکردنەوەکانیان، وەکو هەمووان...
جیاوازی ناکات... بە (پرووشا) بانگی بکەی یان بە (ئاریا)!

جیاوازی ناکات... بە (لەیلا) بانگی بکەی یان بە (مەهدی)..

لەبەرئەوەی ئەوان هێشتا نازانن کوڕن یان کچ و تەنیا سەرنج دەدەنە ئەو دەنگەی کە لەسەری راهاتوون

دیسان دەبێت تێپەڕێ... ببنە سێزدە مانگان...

تا کەمێك فێری قسەکردن و ورتەورت کردن دەبن

دیسان ناکرێ بزانی... دەبێت تێپەڕێ... تا دەبنە نۆزدە... بیست مانگ...

ببنە دوو ساڵان... سێ ساڵان...

تا هێواش هێواش لە نێوان دایە و بابە یەکێکیان هەڵدەبژێرن

ئیتر بەردەوام لاساییان دەکەنەوە...

کچەکان تەنوورە و و کوڕانیش پانتۆڵ لەبەر دەکەن...

ئیتر وا بیردەکەنەوە کە بوونەتە دایك یان باوك

لێرە بەدواوە تێدەگەن کە لەگەڵ یەك جیاوازییان هەیە...

جا ئیتر لێرە بەدواوە تازە کارە بەتامترەکانیان دەست پێدەکات...

کورەکان سەروسیمای باوکیان وەردەگرن...

پەیوەستە بەوەی.. باوکیان وەرزشکار بێت یان جگەرەکێش!

میهرەبان بێت یان تورە...

یارییان لەگەڵ بکات یان نا...

کچەکانیش بەهەمان شێوە...

پەیوەستە بەوەی دایە، زۆربڵێ بێت، یان کەم قسە بکات...

دایە بەردەوام بیانوو بگرێ، یان بە خۆشەویستی و ئەدەبەوە قسە بکات...

هەروەها سەیرتر ئەوەیە ئەگەر دایە بۆڵەبۆڵکەر بێ... کچەکانیش وەك دایکیان بۆڵە بۆل دەکەن...

بەڵێ... زۆر بەتامە کاتێك بە وردی سەیریان دەکەی...

شتگەلێکیان تیا دەدۆزیتەوە کە لە دایە و بابەدا شاراوەیە و یاخود بە شێوەیەکی ئاسایی لێهاتووە...

دیسان گەورەتر دەبن، بەڵام هێشتا بێجگە لە جلەکانیان جیاوازییەکی تر لەنێوان خۆیاندا نابینن...

دیسان گەورەتر دەبن و هێواش هێواش رەگەزیان شێوە وەردەگرێ...

نسبەت بە ڕەگەزی بەرامبەریان هەست بە سۆز و خۆشەویستی دەکەن...

هەستێك کە تا بە ئێستا بەرامبەر بە هیچ بوونەوەرێك نەیانبووە...

هەستێك کە تەنانەت بەرامبەر بە ئازیزترین کەسەکانی ژیانیان (دایە و بابە)ش نەیانبووە...

بەڵام برۆن چی بڵێن؟

بلێن من تۆم هەرگیز نەبینیوە و عاشقت بووم!

برۆن بلێن... لە ملیۆنها ساڵ لەمەو پێش بەمشێوەیە دروست بوون کە کاتێك گەیشتنە ئەم تەمەنە...

بەرامبەر رەگەزی بەرامبەریان هۆگر دەبن؟

رەگەزی بەرامبەر؟

تەنیا شتێك کە لەبارەی یەکترەوە ناتوانن تێبگەن ئەمەیە...

تۆ هاورەگەزی من نیت، من لەبەر ئەم هۆکارەیە کە خۆشمدەوێی

بەڵێ مرۆڤەکان دوو رەگەزیان هەیە و تەنیا کاتێك دەکرێ تێبگەی پێکەوە جیاوازییان هەیە کە ئەوان رووبەڕووی راستییەك دەبنەوە، کە ملیۆنها ساڵ لەمەوبەر لە دەروونیاندا درووست بووە...

بەڵام ئەوان هەرگیز بەم بەڵگەیە رازی نابن، لەبەرئەوەی بە بۆچوونی ئەوان بەڵگەیەکی گرنگ نییە...

هەر لەوکاتەوە شوناسی خۆیان لەبیردەکەن...

بڕیار دەدەن کە وەك کەسێکی تایبەت بن...

ئەو کاتەیە کە تێگەیاندنیان کەمێك دژوار دەبێ...

چونکە ئەوان وەك کەسێکنکە ئێوە هەرگیز نایناسن

یان بەلانی کەم توانای ناسینیت بەو ئاسانیە نییە.

ئەوان دوو رەگەزی جیاوازیانن هەیە، بەڵام هەرگیز باوەڕ ناکەن بەم سادەییە بتوانن عاشقی یەکتری بن.

## من له تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

لەو باوەڕەدام دەکرێ ئەوەندە باش و لەبەردەستدا بین کە ئەوانیتر بە ئارەزوی خۆیان هەڵمانبژێرن.

دەکرێ ئەوەندە باش و جوان بین کە خەڵکی وەکو ئێمەبوون هەڵبژێرن.

دەکرێ ئەوەندە خاوێن و تەندروست بین، کە خەڵکی لە دوورە هەست بە بۆن و بەرامەمان بکەن.

دڵنیام دەکرێ لە ڕێگای راستی و ڕاستگۆییمان، ئەوانیتر تامەزرۆ بکەین کە وەکو ئێمە بن....

هەڵبەتە دەکرێ ئەوانیتر ئەوەندە کەم بگرین و هەموو ساتێك ئاگامان لێیان بێت تاوەکو هەڵە نەکەن

دەکرێ بەردەوام لە دەست و پێیان بئاڵێی تا لەبەر توندی گێژبوون بەردەوام بەربینەوە سەر زەوی

تەنانەت تاوانی کەوتنە سەر زەویشیان بخەنە ئەستۆی ئێمە...

بەڵام من ئەو شێوەیەی خۆمم خۆشدەوێ...

دەمەوێ ئەوەندە باش و نایاب بم، ئەوانیتر هەموو ساتەکانی ژیانیان بیر لە من و وەکو من بوون، بکەنەوە

دەمەوێ هەموو خەڵکی دونیا وەك من بیر بکەنەوە و وەك من ببینن، دەمەوێ...

هەموو شتێك بە راستگۆیی و پاکی بگۆڕم

ئەوەندە ڕاستگۆیم کە تەنانەت فێڵبازترینی مرۆڤەکانیش هەست ئەکەن بۆ قەسەکردن لەگەڵما دەبێت دەست بۆ فرت و فێڵ ببەن..

باوەڕ ناکەم کەسێك کە ئەگەر هەموو ساتەکانی ژیانی بیری لە باشبوون و باش ژیانکردن کردبێتەوە...

نەتوانێ لە ڕێگا باش و خاوێنەکان، دەوڵەمەند و سەرکەوتوو نەبێت...

# من له تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

لەو باوەڕەدام مرۆڤە فیلْباز و قولْبڕەکان مرۆڤگەلێکی وریان...

بۆ ژیان کردن له نزیك ئەوانه دەبێت وریا بین...

لەو باوەڕەدام ئەوان بەرژەوەندی خۆیان باش دەبینن و باش دەتوانن له بیریان بۆ فێڵکردن له گێلەکان سود وەربگرن تا بگەن بەرژەوەندییەکانیان...

بەڵام بۆ من سەلمێنراوە که گێلترین کەسیش، بیر له بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکاتەوە و لانی کەم دەزانێ باشترە...

خۆی له بەرژەوەندەییەکانی سوود وەربگرێ تاوەکو مرۆڤە قۆڵبڕەکان...

هەر بەو شێوەیەی که فێڵباز زۆرە، مرۆڤی نەزان و خۆتێهەڵقورتێنیش زۆرە...

دڵنیام هەرکات زانیان فێڵبازێك ئەوانی هەڵخەڵەتاندوە، بۆ بەدەستهێنانەوەی ئەوەی لە دەستیان چووە هەوڵ دەدەن

لەبەرئەوەی گێلن گرنگ نییە بۆیان چی لەدەست دەدەن، تا چ شتێك بەدەست بهێنن...

باش دەزانم وەها مرۆڤێك، جاری واهەیە ئازیزترین شتی، واتە گیانی، زۆر بە ئاسانی بۆ وەرگرتنەوەی سوودە لەدەستچووەکانی سەرفدەکات.

خراپتر لە هەموو لەبەر ئەوەی سود لە ئاوەزی وەرناگرێ، لە زۆر و هێزی جەستەیی سود وەردەگرێ و لە جیاتی پەروەردە و فێرکردن، سزا دەدات...

کەواتە...

بە بۆچوونی من گێلتر لە گێل کەسێکە، کە گێلێك دەخەڵەتێنێت...

خۆی تووش و قەرزاری گێلێك دەکات...

چاوەکانی دادەخات، چونکە وەك کەو باوەڕی وایە لەبەرئەوەی کە ئەو فزوولەکان نابینێت، ئەوانیش ئەو نابینن! ! و زمانیان لە دەربڕینی راستییەکان دەبەستن و خۆیان لە سوودەکانی فزوولی بێ بەشدەکەن.

کەواتە...

با پێکەوە هەوڵدەین بەوریاییەوە باشبوون هەڵبژێرین...

و بە هۆشیارییەوە رێزگری مرۆڤایەتی و باشە بین

## من لە تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

باوەڕم وایە هەمووان، مرۆڤە باشەکانیان خۆشدەوێن

وە ئێوە بە باشبوونتان، ئارامی و هێمنی بە دیاری دەدەنە ئەوانیتر...

وەلێ باوەڕ بکەن...

کەسی نابینا، هەمیشە یەکەم پارووی گیرفانبڕەکانە و لە گێلێکی باش چ پاروویەکی باشتر دەتوانن بدۆزنەوە بۆ خوێنرێژێکی نزم!

تکایە بە هۆشیارییەوە باشبوون هەڵبژێرن... و بە هۆشیارییەوە بۆ چاکە پێداگری بکەن. جاری واهەیە پێویستە شتێك لەدەست بدەن و بەدەست فێڵبازێکەوە بخەڵەتێن...

تاوەکو پەی بە بەها و گرنگی ڕاستگۆیی و چاکە بکەن و زیاتر لەسەر چاکە پێداگری بکەن.

## من لە تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

لەو باوەڕەدام چاکە و خراپە تەنیا ئەو ناوەنانەن کە لە ڕەفتارەکانمانی دەنێین...

و ناکرێ بە ئاواز و سەدا و ئەو ناوانەی کە بۆ یەکتر هەڵیاندەبژێرین، کەسێك بخەینە ناو کۆمەڵەی باشەکان یان کۆمەڵەی خراپەکان...

شێوازی خراپ، هەمیشە خراپە...

هەڵگیرساندنی شەڕ و خوێنرێژی هەمیشە خراپە...

تاوان و ستەم، هەمیشە خراپە...

تەنانەت ئەگەر ناوی مرۆڤیشت لەخۆت نابێت...و هەزاران مرۆڤی گەمژەش، بەباشی پشتیوانیت بکەن.

زەحمەت نەبێ شتێك لە كۆمەڵەی باش یان خراپ دامەنێ و، هەموو شتێك بەو شێوەیەی كە هەن ببینە...

تاوان تاوانە... كوشتنی مرۆڤ كوشتارە... چ بۆ سزا وەرگرتن بێت... چ بۆ گەیشتن بە پارەو سامان...

ناكرێ بە كوشتنی بوونەوەرە زیندووەكان، بۆ هەمیشە زیندو بمێنیتەوە.

ناكرێ بە كوشتنی مرۆڤێك، ئاسایش بۆ هەمیشە بۆ زیندووەكان بپارێزی.

ئەبێ رێگاچارەیەكی باشتر بدۆزینەوە...

و رێگا چارەكان تەنیا بە راستگۆیانە سەیركردن و بیركردنەوە دەستدەكەوێت.

نەك بە هەستكردن و خەفەت خواردن...

## من له تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

باوەڕم وایە...

مرۆڤە دزەکان هەرگیز ناتوانن شتێك لە پێش ئێمەی مرۆڤەکان بدزن.

باوەڕ ناکەم کەس بتوانێ شتێك لەلای ئێمە لەگەڵ خۆیدا ببات بۆ ئەو دونیا...

و لەو باوەڕەدام دارایی مرۆڤەکان هەمیشە لای مرۆڤەکان دەمێنێتەوە...

چونکە کۆمەڵەی مرۆڤەکان یەك جەستەن و ئێمەش پێکەوە پەیوەستین و پێویستیمان هەیە.

تەنیا یەك شت زۆر ئازارم دەدات...

مرۆڤە دزەکان بە شوێن گۆڕینەوەی ماڵ و سامانی مرۆڤەکان بە قازانجی خۆیان،

برینێك لەسەر جەستەی مرۆڤایەتی و خۆشیان دروست دەکەن، کە زۆر بە سەختی دەرمان دەکرێ...

و لەوانەیە تا چەندین نەوە درێژە بکێشێت و ببێتە هۆی ئەوەی درووستبوونی رق و قینی مرۆڤەکان لە یەکتری...

چەند ناخۆشە کاتێك کە مرۆڤەکان لەسەر یەك زەوی خاکی لە پاڵ یەکتردا ژیان دەگوزەرێنن

لە یەکتر بێزار بن...

هەندێ کات بیر لەمە دەکەمەوە...

یانی مومکینە خەڵکی ئێمە ئەو برینانەی کە وڵاتانی رۆژئاوا لەسەر جەستەی سادەی ئێمەیان درووستکردووە

لەبیری بکەن؟

## من لە تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

چونکە کەسێکی پشوودرێژم و لە گوێ گرتن و بیر کردنەوە ماندو نابم...

چونکە لەسەر ئەم کارە راهاتووم و لەم کارە چێژ وەردەگرم...

بەتایبەت لەبەرامبەر قسە بێ بنەماکانی تۆوە هەرگیز هەست بە لاوازی و شکست ناکەم.

باوەڕم وایە ئەو مافەم نییە، خۆم بەبێ هۆ، بۆ قسە بێ بنەماکانت نارەحەت بکەم.

لەو بڕوایەدام تا کاتێك کە خۆت لە ڕەفتاری خۆت ماندوو نەبی، مافی ئەوەم نییە یارمەتیت بدەم تا بیروباوەڕت بگۆڕی...

ئەسڵەن تێناپەڕێنم و لەو بڕوایەدام دەبێت خۆت لە راستییەکانی ژیان تێبگەی...

ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر بیروباوه‌ڕت ته‌نیا شایسته‌ی ناو ته‌نه‌که‌ی خۆڵه‌که‌ش بێت...

باوه‌ڕم وایه هه‌ر ڕه‌فتارێکی تاك لایه‌نه له‌لایه‌ن منه‌وه، جۆرێکه له ده‌ستدرێژیکردن.

و من مافی ئه‌وه‌م نییه به پێداگیریکردن بیروباوه‌ڕت بگۆڕم... ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر باوه‌ڕه‌که‌شت شایسته‌ی فڕێدانیش بێت...

ده‌بێت قسه بکه‌ی و له‌گه‌ڵما ده‌رده‌دڵ بکه‌ی... ده‌بێت ئه‌وه‌نده دووباره‌ی بکه‌یته‌وه، تا تێبگه‌ی چه‌نده بێ بنه‌مان...

ده‌بێت هه‌ستت وه‌رگێڕی و تا ده‌توانی ڕسته دروست بکه‌ی.

من تۆم به‌م باوه‌ڕه‌وه هه‌ڵبژاد، جا ئێستا ئه‌گه‌ر له بیروباوه‌ڕت ماندو بووم...

مافم نییه نییه به زۆر ئه‌وانه‌ت لێوه‌ربگرم...

له‌وانه‌یه ده‌بێت ته‌نیا به‌جێت بهێڵم...

له‌وانه‌یه ده‌بێت به‌ته‌نیا بم...

لەوانەیە دەبێت بیر لەبیروباوەڕەکانمان بکەینەوە...

لەوانەیە وا باشتر بێت لەبارەیانەوە زیاتر پێکەوە قسە بکەین...

چەندە چا خواردنەوە و قسەکردنم لەبارەی بیروباوەڕەوە خۆشدەوێت...

چارەسەری گیرو گرفتم بە گفتوگۆکردنەوە چەندە خۆشدەوێت...

چەندە ژیانی ئاقڵانە لەسەر ئەساسی بیرکردنەوەوە خۆشدەوێت...

چەندە لەگەڵ تۆبوونم خۆشدەوێت...

## من له تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

فشارەكانی كۆمەڵگە...

بەزۆری لەگەڵ هەمووان دەدوێ...

بە منی دەوت... دەبێ بڕۆیتە قوتابخانە... و لەوانەشە مافی ئەوبێ...

ئێ من منداڵ بووم و تێنەدەگەیشتم و تەنیا ئەو شتەی كە پێیان دەوتم باوەڕم پێدەكرد

ئیتر ڕۆیشتمە قوتابخانە...

شوێنێك كە خوێندن و نووسینیان فێركردم و لە پاڵ ئەم خاڵە ئیجابییە كۆمەڵێ كاری خراپیش!

لێدانی یەکتر ... جوێندان... شەڕکردن...

تف کردنە سەر جلو بەرگی یەکتری...

سڕینەوەی لوتمان بە شەڕواڵەکانی یەکتری...

جوێندان بە دایك و باوکەکانمان...

گاڵتەکردن بە مامۆستایان و پێکەنین بە ڕیشی هەموو مرۆڤەکان...یش فێر بووم...

فشارەکانی کۆمەڵگە زۆر قسەی دەکرد و منیش بیرم دەکردەوە مافی ئەوە و ناچارم گوێ لە هەموویان بگرم...

فشاری کۆمەڵگە باوەڕی وابوو کە من ئەبێ لایەنی کەم پۆلی شەش تەواو بکەم تاوەکو کارێکم بۆ بدۆزرێتەوە...

هێشتا پۆلی شەشم تەواو نەکردبوو، سەرجادەکان پڕبوون لە بەکالۆریۆسی شۆفێر و بێکار...

کە ئامانجیان پەیداکردنی داهاتێك و هاوسەرێك... بوو

فشارەکانی کۆمەڵگە پێیدەوتم دەبێت بچیتە زانکۆ...

بەڵام خۆشبەختانە هێشتا پۆلی شەشم تەواو نەکردبوو و چەندین ساڵ لە ڕیزدا بووم، چونکە ملیۆنەها تەمبەڵی وەکو خۆم لە ڕیزدا بوون تا زانکۆ وەریان بگرێ!!

هەموو پێیاندەوتم هێی کوڕە ئەبینی شەقام پڕە لە بەکالۆریۆس، مەگەر تۆ چێت لەوانی تر کەمترە؟

دەبێت لایەنی کەم بەکالۆریۆست هەبێ تاوەکو کەس پێت پێنەکەنێ...!!! خەڵکی چیدەڵێن؟؟

ئەمانە هەندێ قسەی فشارەکانی کۆمەڵگە بوون کە هاوڕێکانم بۆیان وەردەگێڕام...

تازە هانکە هانك پۆلی شەشم تەواو کردبوو کە بەکالۆریۆسەکان هەموو ڕۆژ تەلەفزیۆن نیشانی دەدان

کە داوای کاریان لە حکومەت دەکرد... سولفەیان دەوێت... خانویان دەوێت...

بە بیرم دێت کاتێك هەموو پێکەوە بۆ ڕۆیشتن بۆ زانکۆ پێشبڕکێیان دەکرد...

گرنگ نەبوو چ بەشێك، گرنگ ڕۆیشتن بوو بۆ زانکۆ.

لەبیرمە یەکێك لە هاوڕێکانی باوکم دەیوت: برۆ زانکۆ، تەنیا برۆ، گرنگ نییە چ بەکالۆریۆسێك دێنی.

بەکالۆریۆسی چەقەنە لێدان بێنە!!

تەنیا بەکالۆریۆسێك بگرە... هاوڕەنگی کۆمەڵ بە!!

کاتێك زۆر بە ئاسانی بە ڕێگایەکدا دەڕۆیت کە ئەوانی تر بۆت دیاری دەکەن

جێی سەرسوڕمانی نییە کە زۆر ئاسان دوچاری کۆمەڵێگ گرفت دەبی کە هەرگیز بیرت لێنەدەکردەوە...

ئەوەندە لە چاوەڕوانی مامەوە تا هاوڕێ و هاوپۆلەکانم لە زانکۆ هاتنە دەرەوە...

هەر ئەو هاورێ دەستوپێ سوتاوانەم بوون کە چەند ساڵ لەمەو پێش پێکەوە وانەمان دەخوێند...

مرۆڤگەلێکی بێ ئامانج کە تەنیا دەیانزانی لاسایی بکەنەوە و کەسێك پێیان بڵێ چی بکەن و چی نەکەن...

بەڵام من وا فێر بووم کارێك ئەنجام بدەم کە خۆشمدەوێ... و ئەم رەفتارەشم هەر لە منداڵیەوە نیشانی هەمووان دابوو.

و هەر لەو منداڵیەوە نیشانی هەموانم دابوو کارێك ئەنجام دەدەم کە خۆشمدەوێ.

من لە جیاتی رۆیشتن بۆ زانکۆ تەنیا مابوومەوە و تەواوی رۆژ لەناو ئاوێنە لەگەڵ خۆمدا قسەم دەکرد...

تا ئەوەی دیسان فشارەکانی کۆمەڵگە دەستی کردەوە بە قسە کردن لەگەڵ من و هاورێکانم...

فشارەکانی کۆمەڵگە دەیوت کارمان بۆ بەکالۆریۆسەکان نییە.. کارمان بۆ ئەوانەی شەشیان تەواو کردووە نییە

بۆ خانوو دەبێ پارە بدەی، بەکالۆریۆس و بڕوانامەمان پێویست نییە...

دەیوت ئەوانەی پارەیان نییە بڕۆن لەناو سەتڵی زبڵەکەدا بژین...

دەیوت کەسێك کە پارەی نییە، واتە هیچی نییە...

بێ نرخ... بێ دۆست... بێ کەسایەتی... بێ خانوو... دەبێت بڕوات بۆ زبڵدان.. بەڵێ هەر بەم ئاسانییە قسەی دەکرد، تەنیا ئەوەندە بەس بوو ورد بیتەوە و گوێکانت بکەیتەوە...

هەر بەو ئاسانییەی کە دەڵێم قسەی دەکرد..

دەیوت جگە لە زبڵدان، شوێنێك بۆ ژیانکردنی تۆ نەماوەتەوە!

فشارەکانی کۆمەڵگە دەیوت: لەبەر ئەوەی کە هەژاری، دەبێت تەنیا بژی...

فشارەکانی کۆمەڵگە دەیوت: کچ و کوڕە لاوەکان نابنە هاوڕێت، چونکە بێ پارەی و لە هاوڕێ باشەکان، هەواڵێك نییە...

فشارەکانی کۆمەڵگە دەیوت ناتوانی بە دڵی خۆت لەگەڵ کەسێکدا هاوسەرگیری بکەی...

فشارەکانی کۆمەڵگە دەیوت لەبەر ئەوەی جلێکی گونجاوت نییە، ناتوانی لەسەر شەقام بڕۆی بە ڕێدا...

فشارەکانی کۆمەڵگە تا دڵی ویستی قسەکانی کرد...

منیش بە تاقەت، قسەکانی بە چاوەکانم، هەستەکانم و گوێکانم وەرگێڕا.

لەم ماوەیەدا کە تەنیا بووم و بواری بیر کردنەوەم هەبوو، گەیشتە ئەو ئەنجامەی، کە کێشە و فشارەکانی کۆمەڵگە زۆر قسە دەکات و هەڵبەت تەنیا قسە دەکات...

منیش تەنیا ڕێگە دەدەم فشارەکانی کۆمەڵگە قسە بکات...

چونکە کاتی کردەوە، ئەوە خۆمم کە دەبێ کار بکەم...

و بڕیار دەدەم...

چونکە ئەو هەمیشە لە دواوە بە ئاماژە قسەی دەکرد

و جورئەتی ڕووبەڕوو بوونەوە و وتنی ڕاستیەکانی بە من نەبوو...

و هەرکات پێویستم پێی بوایە، ون دەبوو...

و ئەوە خودی من بووم کە دەبووایە تێچووی ژیانم بدایە...

بە ڕاستی پێکەنیناویە... بەڵام هیچ گرنگ نییە، فشارەکانی کۆمەڵگە، ڕیگات پێدەدەم تەنیا قسە بکەی...

بەڵام ئەوە خودی منم کە دیاری بکەم بڕۆمە زانکۆ یان نەڕۆم...هاوسەرگیری بکەم یان نا... بژیم یان نا..

ئەگەر پێتوایە ژیان لە ناو زبڵداندا، زۆر بەتامە، دەتوانی چەند شەوێك میوانی من ب، ئەوێ تاقی بکەیتەوە...

پێشنیار دەکەم زستانان ئەم کارە ئەنجام بدەی...

لەبەرئەوەی دەتوانی بە جلی دڕاو و بە رووتی لەناو بەفردا بخەوی...

و لە سڕ بوون و بە تەختەبوونی دەست و پێکانت چێژ وەرگری...

بەستن و ژیان لە هەژاری دا بەتامە... نا؟؟

# من له تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

تا ئێستا کەس دەستدرێژی کردۆته سەرتان؟

هـــا؟

هاوڕێی زۆرم هەبوون و هەمه که ئەمڕۆ ئیتر ئەوەی که ئەبوایه ببوایەن، نین...

زۆرجار لەسەر تاڵییەکەی قسەیان بۆ کردووم، ئەوەنده تاڵ، که ئامادە نین

هیچ مرۆڤێکی تر، ئەو دەستدرێژییە تاقی بکاتەوە...

دەزانی دەستدرێژی به هەموو شێوەکانیەوە خراپ و زیانبەخشه...

جا چ ئەم دەستدرێژییه بۆ سەر زەین و ئەندێشەی مرۆڤەکان بێت...

چ بۆ سەر جەسته و لاشەیان...

چ بۆ سه‌ر نشتیمانیان بێت...

چ بۆ سه‌ر بیرکردنه‌وه‌ و ئاره‌زووه‌کانیان...

تکایه‌ گاڵته‌ به‌که‌س مه‌که‌ن...

تکایه‌ بێڕێزی به‌رامبه‌ر بیروباوه‌ری ئه‌وانی تر مه‌که‌ن...

و به‌ وشه‌ی ناشیرین و ره‌ق به‌سه‌ر هه‌سته‌کانیاندا مه‌ڕۆن...

تکایه‌ ده‌ستدرێژی مه‌که‌ بۆ سه‌ر سنور و جه‌سته‌ی مرۆڤێك که‌ ئاماده‌ نییه‌...

ده‌ستی لێبده‌ی...

باوه‌ڕ بکه‌ن زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌ك، هه‌ستێکی باش، شۆخی کردنێك...

به‌های ئارامگرتنی ساڵانێك کابووس و نه‌فره‌تی نییه‌...

باوه‌ڕ بکه‌ن...

# من لە تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

مرۆڤە گێل و نەگۆڕەکان

تا ئێستا منداڵی ئینکاری دوو ساڵانت بینیوە؟

یا پیاوەپیرە ٧٠ـ٨٠ ساڵەکان، کە وا بیر دەکەنەوە هەموو شتێك تێدەگەن و چاکەی هەمووان دەزانن؟

تا ئێستا لەگەڵ مرۆڤە گێل و نەگۆڕەکاندا ڕووبەڕوو بوویتەوە؟

ئاوەزیان نییە و ئینکاری دەکەن...

و کەمتر بیر دەکەنەوە، لە جیاتی ئەوە، زیاتر هێزیان بەکار دەخەن.

کاتێك دەمەوێ شتێکیان فێر بکەم کە خۆشیان ناوێ...

ئەگەر ئینکاری بکەم، هەمیشە دۆڕاوم...

کەواتە فێردەبم لەسەرخۆ و بە ئارامی سەیریان بکەم...
و لە ڕێگای باشترەوە بە ئامانجەکەم بگەم...
هەرچەندە هەندێجار بە بیرکردنەوە بێ سەروبەرەکانیان شێتم دەکەن.
دیسان هەوڵ دەدەم بە وردی و ئارامگرتنێکی زیاترەوە تێیان بگەم
لەبەر ئەوەی ئینکاری کردن لەگەڵ ئەمجۆرە مرۆڤانە سودی نییە و ئەوانە گێلن و هەرگیز لە هەڵەکانیان پەند وەرناگرن...
دەزانن ئەگەر باسکردنی کێشەکان بۆ مرۆڤە گێلەکان وەك مەتەڵێك سەیر بکەن.
لە دۆزینەوەی وەڵامی ئەم مەتەڵانە چێژ وەردەگرن...
هەرچەندە لەوانەیە لە قسە بێ سەروبەرەکانی ئەم مرۆڤانە شێت ببیت.
بەڵام یارمەتیدانی ئەم کەسانە بە تەواوی بەتامە و بەهای ماندوو بوونەکەی هەیە...
و هەر سات کە ئەم کەسانە زیاتر و زیاتر پێش دەکەون.

ئێوە خۆشحاڵ و خۆشحاڵتر دەبن.

و کەسایەتی ئێوەش ئامادەتر و بەهێزتر دەبێت...

هەڵبەت دەکرێ بە ئینکارییەوە لەگەڵیان گفتوگۆ بکەی و هەستەکانیان بریندار بکەی.

دەکرێ لەگەڵیان بە شێوەیەك رەفتار بکەی، کە لە سەر هەڵەکانی خۆیان پێداگری بکەن.

دەکرێ وایان لێبکرێ کە ئەوانە گێل تر و گێل تر ببن...

دەکرێ کارێك بکرێت ئەوانە لە دەربڕینی بیرۆکە گێلانەکانیان واز بێنن.

و ببنە نەزانێکی شاراوە !

و وەکو نەخۆشێك لە تەنیشتمانەوە ژیان بکەن و ئێمەش کاتێك پێیان بزانین

کە چارەنوسمان کەوتبێتە دەست ئەوانە...

وەکو شۆفێرێکی تەکسی دوای گفتوگۆ و لیکۆلێنەوە تازە تێدەگەین، کە بەرامبەر

نەزانە !

ئەو کاتەش ئێمە لە ناو ئۆتۆمبیلەکەی ئەو داین...

بەڵێ لە ناو ئۆتۆمبیلی نەزانێکی شاراوە !

ئەم گێلە شاراوەیە لەوانەیە مامۆستا، دایك یان باوك یان منداڵەکەمان بێت...

یان هەر ئەو شۆفیرەی تەکسی کە نەزانێتییەکەی خۆی لە زەینیدا شاردبوویەوە...

و ئێستا ئێوە لەگەڵ نەزانێکی تورەدا ڕووبەڕوون

و ئیتر کار لە کار ترازاوە !

تکا دەکەم ڕێگە بدەن نەزانەکان قسە بکەن.

قسەکانیان ببیستن هەوڵ بدەن بە میهرەبانی و حەوسەڵەوە، چاکیان بکەن... بیر لە بیر و باوەڕەکەیان بکەنەوە و لە خۆتان بپرسن چی بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەم مرۆڤانە وەها بیرو باوەڕێکی گێلانەیان هەبێت.

## من له تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

بەرامبەر کارە هەڵەکانت، هەرگیز کارێك ناکەم، کە ئەوانی تر رام دەسپێرن! هەرگیز تەمێت ناکەم... هەرگیز لە هەڵەکانت تۆڵە ناکەمەوە... و بەرامبەر خراپترین فشاردا، نات خەمە ژێر فشارەوە...

ئازیزم تۆ مرۆڤێکی،

دەزانی؟؟ کاتێك من ئامێرێك دەکرم، کاتی خراپ بوون، ئەو ئامێرە چانسی چاککردنەوە و رێکخستنەوەی هەیە! تۆ بۆچی کاتێك هەڵەیەك دەکەی، دەبێ چانسی چاککبوونەوە و رێکخستنەوەت نەبێت و کاتێك گرفتێکت هەیە، منیش ئازارەکانت زیاد بکەم؟ خۆزگە کەمێك زیاتر مرۆڤ دەبووین...

تا لە نێوان مرۆڤەکاندا، بوون بۆ تۆ و ئەوانی تر ئەوەندە ئازاراوی نەبێت!

## من لە تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

من خۆرم خۆش دەوێت، چونکە...

هەمیشە خۆیەتی و هەرگیز ڕەنگ و تایبەتمەندی خۆی لە دەست نادات

و هەمیشە کێشکردن، نوور، گەڕان، جوڵە و ڕێساکانی دەپارێزێت..

بە شوێن بەهاکانیەوەیە و کارێك ئەنجام دەدات کە لە ڕاستیدا دەبێت ئەنجامی بدات...

و هەمیشە وەکو خۆر بەرەو پێش دەڕوات...

لەبەر ئەمەیە...

ئێمەی خەڵکی سەر زەوی ساڵانێکە زیندووین و ژیان درێژەی هەیە...

لەبەر ئەوەی خۆر کاری بەوە نییە چ گیانلەبەرانێك سوود لە وزەکەی وەردەگرن

خۆماڵی یان کێوی...

هەرکەسە و ئەندازەی توانا و شایستەبوونی ژیان دەکات...

من خۆرم خۆشدەوێت، چونکە بە هەمووکەس مۆڵەتی ژیان دەدات.

لەگەڵ ئەو توانایەی کە هەیەتی سنوور بۆ کەس دانانێ...

و لە نێوان خۆرپەرست و مرۆڤەکان جیاوازی ناکات...

دڵنیام ژیان ئاسان دەبێت

کاتێك خۆر بیر لە شتێك دەکاتەوە کە دەبێت، ببێت...

و من بە شتێك کە دەبێت ببم، بیر دەکەمەوە...

لەبەر ئەوەیە وەکو خۆربوونم خۆشدەوێت.

منیش دەمەوێت خۆم بم

ڕاستگۆ و حەقیقی...

لەو باوەڕەدام، دەبێت ڕێگاش بە ئەوانی تر بدەم خۆیان بن..
و تەنانەت هەندێجار دەمەوێت لە بەرژەوەندی ئەوانی تر بکشێمەوە...
تا ئەوان ئەو شتەی کە وادەزانن هەن، نیشانی بدەن...
بۆم گرنگ نییە، ئەگەر لەم هەلە سود وەرگرن
و خراپترین ڕوخساریانم پێ نیشان بدەن
چونکە بەهەرحاڵ دەبێت چییەتی دەورووبەرمان بناسین...
و ناتوانین تا کۆتایی لە دەستیان هەڵبێین...
هەندێ لە مرۆڤەکان بەڕاستی وادەزانن، هەمیشە ماف بەوانە...
تەنانەت ئەگەر لە ڕاستیشدا ماف بەوان نەبێت...
ئەوانە ناشرینترین ڕوخسار دەدەنە خۆیان
و بێ ترس شتێك نیشان دەدەن کە هەن...

و هەر بەو روخسارە ناشیرینەوە بە خۆیاندا هەڵدەدەن
دەزانیٚ؟؟؟؟
لەو ساتەدا من وریاتر و باشتر دەبم...
و باشتر ئەوانە دەناسم..
ئەڵبەت هەمیشەش بەو ئاسانیە نییە
و گرفتیشی تێدایە، بەڵام من عاشقی ناسیڕن
و باشتر بینینی ئەوانی ترم...
و تەنیا کاتێك دەگەمە ئەو پلەیە، کە
هەورەکان بخەمە لاوە و، مۆڵەت بدەم ئەوانی تر، راستیی خۆیان نیشان بدەن.

## من لە تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

لەو باوەڕەدام و ئامادەم بۆ ڕاستیی بەهایەکی زۆر بدەم.
تا مرۆڤەکان ڕوخسارە جوان و ناشرینەکانیان نیشان بدەن...
من ڕاستگۆییم دەوێت، کەواتە دەبێت بەهاکەی بدەم.
وەکو برسییەك کە نانی دەوێت...
و بەهای لادانی برسێتییەکەی، دەبێت بیدات...
من ڕاستگۆییم دەوێت
تەنانەت ئەگەر وەکو تاوس لە هندستان بێت...
کەواتە دەبێت بۆ هندستان بڕۆین...

زۆرێك داهاتێك بە ئەندازەی گیانیان، بۆ ڕاستیی دەدەن، من تازە خەریکم فێری ئارامگرتن تەحەمولکردن دەبم...

وەك یاریزانێکی شەترەنج کە بۆ بە هێزکردنی زەینی، یاری شترەنج دەکات...!

زۆر ئاسانە و زۆر بە چێژە...

باوەڕم وایە ئێمەی مرۆڤەکان سەرپشکین... هەرشتێك بەو شێوەیەی کە ئارەزوومان لێیە ببینین...

یان بەم شێوەیە بیلێم باشترە.. دەتوانین بە هەر شێوەیەك کە ئارەزوومان هەیە ژیان بکەین.

ئێمە دەتوانین تێڕوانینمان هەلبژێرین و، بە دلنیایی پێویست ناکات وەکو ئەوانی تر بۆ کێشەکان بڕوانین..

و ئێمە دەتوانین وەکو بیریارێك بۆ کێشەکان بڕوانین و خاڵە فێرکارییەکانی کێشەکە دەرك بکەین...

و داتوانین وەکو سواڵکەرێکی حەسود بڕوانین و چاوی بینینی بەختەوەری و شادی ئەوانی ترمان نەبێت..

لە سەرەتادا، هەڵبژاردنی تێڕوانین، کەمێك سەختی تێدایە

سەرەتا کەمێك سەیر دێتە پێش چاو، و مرۆڤ لە خۆی دەپرسێ، مەگە دەکرێ..؟؟

مەگەر دەکرێ ڕووداوێك بە جۆرێکی تر ببینین...!

بەڵێ دەکرێ، بەم ڕەفتارە دەڵێن بەڕێوەبردنی تێڕوانین...

و ئەگەر ئێمە بتوانین تێڕوانینمان بگۆڕین... گەیشتووینەتە پلەی بەڕێوەبەرێتی تێڕوانێن.

و کەسێکین کە دیدگا و جۆری تێڕوانینمان، خۆمان هەڵیدەبژێرین.

پزیشکی مو، بەشێوەیەکی جیاواز سەیری موەکانی ئێمە دەکات...

هەر بەو شێوەیەی کە ئارایشگەرێك زۆر جیاواز سەیری موەکانمان دەکات...

مرۆڤەکان بە پیشە و خووی جیاوازەوە، تێڕوانینی جیاوازیان هەیە...

و براوە کەسێکە کە خۆی تێڕوانینەکانی هەڵبژێرێت و ڕێگە نەدات ئەوانی تر یان پیشەکەی

تێڕوانینی بۆ دەستنیشان بکەن...

هەوڵبدن هەمیشە لە بەرزییەوە سەیری کێشەکان بکەن...

هەوڵبدن دوورتر نوکی لوتتان ببینن...

کەسایەتی ئێمەی مرۆڤەکان بە تێڕوانینمان دەگۆڕێت...

تکایە لە بەرزترین دیدگاکانەوە بڕوانن.

# من لە تۆ هۆشیارترم، لەبەرئەوەی...

یاساکانی ژیان لەگەڵ مرۆڤەکان...

ئەم دنیایە تەنیا یارییەکە... و دەبێت وەکو یارییەك بۆ بڕوانی...

و لەم ڕووەوە ئەوەش بزانە، هیچکەس لەم دونیایەدا ناچار نییە، ڕۆڵێك بگێڕێت کە خۆشی ناوێت...

ئەم دنیایە یارییەکە و بۆ سەرکەوتن لەم یاریەدا، دەبێت یاساکانی یاریش باش بزانی...

دەبێت لەگەڵ مرۆڤەکان هاوڕێ بیت و، خۆشت بوێن...

دەبێت هەست و پێداویستییەکانیان وەکو پێداویستییەکانی خۆت بزانی و دەرکیان بکەی...

تۆ لەنێوان مرۆڤەکان دای...

کەواتە دەبێ ڕێزیان بگری و مۆڵەت بدەی ئەو شتە بن کە خۆشیان دەوێت...

و دیسان دووبارەی دەکەمەوە تۆ لە نێوان مرۆڤەکان دای و بە میوان دادەنرێی...

بەڵێ تۆ لە نێوان مرۆڤەکان دای... کەواتە هەوڵبدە ڕێزیان لێبگری و لە بیریاندابی.

ئەگەر ئازاریان بدەی... نارەحەت دەبن... هاوار دەکەن... هەستی خۆیان نیشان دەدەن...

ئەگەر دیسان زیاتر ئازاریان بدەی... وەکو خۆت ڕەفتار دەکەن و هەندێکیان کە مرۆڤترند کەمێك لێت دوور دەکەونەوە... و ئەگەر زۆر ئازاریان بدەی... بۆ هەمیشە لێت

دوور دەکەونەوە... و لەوانەیە هەرگیز لێت نزیك نەبنەوە، و ئەگەر زۆر ئازاری مرۆڤەکان بدەی، دڵگران دەبن و بۆ هەمیشە لێت دوور دەکەونەوە،

هەندێکیان دەڕۆنە گۆشەیەك و هێواش دەست دەکەن بە گریان...

بەڵێ... هەموو مرۆڤەکان کاتێك ئازار دەدرێن و نەتوانن هیچ کارێك بکەن، دەست دەکەن بە گریان...

کاتێك ئازار دەدرێن، بە تەنیا دەژین و، ئەمە مانای کۆتایی یاری جوانی ژیان لەگەڵ تۆ...

واتە مرۆڤەکان ئارەزوو ناکەن لەگەڵ تۆدا یاری بکەن...

واتە ئارەزوو ناکەن لەپاڵ تۆدا بن و وا بە باشتر دەزانن لە بێدەنگی و دور لە ئازار زیندوو بن...

چونکە تۆ ڕێزت لە یاسای یاری ئەوان نەگرت و یاری ئەوانت تێك دا...

وەکو ئەوکاتەی کە دایك یان باوکیان بێ مۆڵەت وەرگرتن دەمرێت و بەشێکی گەورە لە یاریەکەیان تێك دەدات...

ئەوانە دەست دەکەنە گریان و لەوەی دایك یان باوکیان ئیتر نییە کە رۆڵی خۆیان بگێڕن..

ئەفسوس دەخۆن.

ئەوان، لەوەی کە، کەسێك لەو کاتەوەی چاویان کردۆتەوە و پێیان خستووەتە ناو ئەم یاریەوەلەگەڵیان بووە و، لە منداڵی و سەرەتای یارییەکەوە لەگەڵ ئەوان گەورە بووە. ئیستا نییە و شوێنە چۆڵەکەی هەستی پێدەکرێت...

دڵتەنگ و زوویر دەبن... و هەست دەکەن ئێستا ناچارن بە تەنیا درێژە بە یاریەکە بدەن...

و باوەڕ بکە هیچ شتێك هێندەی تەنیا یاری کردن ماندووت ناکات...

تکایە ئاگادار بە هاوڕێ یاریچییەکانت مەڕەنجێنە... و بەوانیش بواری یاریکردن بدە...
تکایە مرۆڤەکانت خۆش بوێ و مۆڵەت بدە ئەوانیش ئەو رۆڵەی کە خۆشیاندەوێ بیگێڕن.
و هەوڵ مەدە یاسای یارییەکە بە سوودی خۆت بگۆڕی...
چونکە هەموو پێیان خۆشە رۆڵێك بگێڕن، کە خۆیان هەڵیانبژاردووە
نەوەکو ئەو رۆڵەی کە تۆ بۆ ئەوان پێت خۆشە..
هیچکەس ئامادە نییە لەبەر تۆ رۆڵێکی دەستکرد و ناچاریی بگرێتە ئەستۆ...
و کەسێك بێت کە نەبووە... بەو بەڵگەیەی تۆ پێت خۆشە رۆڵەی ئەوان دیاری بکەی...
و ئەگەر لەم کارەدا پێداگری بکەی
ئەو کاتە ژیان دەبێتە دەستکرد و لە باری سرووشتی دەچێتە دەرەوە...
ئیتر یاری ژیان تێکدەچێت و کەس پێی خۆش نییە یاری بکات..

هەموو ماندوو و دڵتەنگ دەبن و هەموو شتێك تێكدەچێت..

و تەنانەت ئەم كتێبە كە ئەمڕۆ بەشێكە لە یاریەكانی من خراپ دەبێت...

تكایە با هەموو پێكەوە یاری بكەین و هەر كەس ئەو ڕۆڵە بگێڕێت كە پێی خۆشە...

تەنیا تكا دەكەم... لە بیرمان نەچێت... ئێمە خەریكین یاری دەكەین... و كەس لە دۆڕان و شكست، تووڕە نەبێت...

و لە هەر شوێنێك هەستتان كرد یارییەكە جددی دەبێت و لە بارەی باشتربوونی یارییەوە پێكەوە قسە بكەین...

ماوەیەك لەمەوبەر یەكێك لە هاوڕێ یاریچییەكانمان نەخۆش كەوت...

كچێكی گەنج، جوان كە ڕۆڵی خزمێكی دووری منی دەگێڕا.

ئەو نەخۆش كەوت و، ناچار بوو ڕۆڵی نەخۆشەكان بگێڕێ...

نەخۆشی ئەوەندە لاوازی كرد، كە تەشەنوجی كرد و بێ هۆش بوو.

و بە خەوێکی قوڵدا چوو... نزیکەی هەشت رۆژ لەو خەوە قوڵە بوو...
تا کۆتاییەکەی لە بیست و چواری رێبەندان لە رۆژێکی ساردی زستاندا، دونیای یاریەکەی ئێمەی چۆڵ کرد
و ئێمەی بە تەنیا بەجێهێشت...
هەرچەندە چەندجار زیاتر لە نزیکەوە نەمبینیبوو، بیرەوەرییەکی ناڕوونم لێی هەبوو
بەڵام هەمیشە خۆشەویستی لە دڵمدا بوو و، زۆر خۆشم دەویست.
کاتێك هەواڵی رۆیشتنیم بیست، تووشی شۆك بووم...
یاری بێ ئەو هێشتا بەردەوامە و هەموو سەرقاڵی یار کردنن...
هەرچەندە ئەوم کەمتر لە نزیکەوە بینی
بەڵام من هێشتا هەست بە شوێنە بەتاڵەکەی دەکەم... و هەندێجار بیری لێدەکەمەوە...

چونکه باوەڕ ناکەم... هاوڕێیەکی باش، که دەیتوانی وەها باش ژیان بکات و درێژه به یاری بدا، ئێمەی تەنیا بەجێهێشت و ڕۆیشت.

لەو ڕۆژه بەدواوه، من بڕیام دا یارییەك لەسەر یارییەکانی ژیانم زیاد بکەم...

لەبەر ئەمه هەندێك له شەوان که لەسەر قەرەوێڵەکەم دادەنیشم، دەستەکانم دەدەم به یەکدا...

لەگەڵ خۆمدا یاری پاڕانەوه ئەنجام دەدەم...

و بیر لەم بابەته دەکەمەوه، که ڕۆشتنی هاوڕێیەکی گەنج و میهرەبان...

چەنده دەتوانێ مرۆڤ بخاته ژێر کاریگەرییەوه

ئەوەنده کارگەریی که مرۆڤ وا لێدەکات رۆڵی شێتەکان بگێڕێت...

تا هەندێك له ناڕەحەتییەکانی زەوی یارییەکه دوور بێت...



من بیر لە بەختەوەری هەردووکمان دەکەمەوە.
تەنیا ئەوەندە بەسە بەر لە هەر کاریک فێرت
بکەم چۆن لە مێشکت سوود وەربگری...
ئەوەندە بەسە فێرت بکەم...
بەر لە سود وەرگرتن لە مێشکت بۆ
ئاوەدانکردنەوەی ئەوانی تر...
ئاوەدانکردنەوەی خۆتت، فێر دەکەم...
تا لەگەڵا رەنج و نارەحەتیەکاندا رابێی...
فێر ببی... بۆ پێویستییەکانت، خۆت بەکار ببەی،
نەک ئەوانیتر...

چاپکردنی چاپخانەی ماردین